# (بەد خــەوی)

## -1-

**- کورش ئەم شیعرەی مەحوی زۆر جوانە کەدەڵێت:**
**بەئاوی تێگەین ئێمە دونیا...کەچی هەر سەرابێك بوو**
**هەموو دەچین بەخنکان و لەوشکیشە مەلەی مەخلوق**
ڕاستە **دۆست** شیعرێکی دڵگیرە

**- لای من هەردڵگیر نییە، بەڵکو زۆرکات دڵگرە و ئەمخاتە شوێنێك کە خۆم زۆر بەبچوکی ئەبینم، بەشێوەیەك کەبەزەیم بەخۆمدا دێتەوە، لەبچوکی خۆم و لەگەورەی گەردوون سەرم سوڕدەمێنێت، ئێمە زۆر کەم ئەبینین و ئەم وێنەیە زۆر لەوەگەورەترە باسمان کردووە تائێستا**
هەق بەتۆیە،لەڕاستیدا منیش وای بۆ دەچم کە ئەم ژیانە هەر ئەو تۆزە نییە کەدەیبینین و زیاترە
**- بەڵام کورش ئەوەی زۆر جار ئازارم ئەیات ئەوەیە کە دەبینم لەسەر دنیایەك شت بەسادەی و پەلەپروزێ لەملاولا قسەئەکرێ بێ ڕاوەستان ، بێ پرسیار..**
ڕاستە بەڵام گرنگیان پێ مەدە
**- گرنگیشیان پێ نەدەم ئازارم هەر ئەدەن بەشی خۆیان، من وەك خۆم لەسەر هەموو شتێك پرسیارم هەیە ، ئەمە ئەکرێ نەخۆشیەك بێت بەڕای تۆ؟**
نا من وای بۆناچم
**- بەڵام من وای بۆدەچم ، زۆر پرسیارکردن لە کۆی جومگەکانی_تاك شتێ_قسە گەلی وەك ناتەواو ، زۆر بلێ ، شێت ..هتدی بۆ من هێناوە بەدیاری هەمیشە**
ممم! بەڵام بەو شێوەیە ئەبێ خۆت بزانی کە ناگونجێ ئەو شەرابەی دانایان وەك میرات بۆ ئێمەیان جێ هێشتووە دەرخواردی هەموو کەسێکی بدەین
**- مەبەستت چییە؟!**
مەبەستم ئەوەیە ئەو قسانەی تۆ لەسایەی خوێندنەوە و تێفکرینەوە دەیان کەیت لەگەڵ کەسانی تر حەقیقەتۆچکەن هەندێکیان، جا پێدانی ئەم هەقیقەتۆچکانەش بەیەکجار بەکەسێك ، ئەشێ وەك چۆن ئاوی ڕوون گۆڕا بەشەراب بەکەرەمی یێشوع، ئاوهاش شەرابی ئەم هەقیقەتۆچکانە لەسەردەستی تۆ بگۆڕێت بەژەهر، ئەوانیش هەقی خۆیانە توندئاژوو بن لەگەڵت کە دەزانن خەریکی ژەهریان دەرخوارد ئەدەیت.
**-مەبەستت لە هەقیقەتۆچکە چییە کورش؟!**
مەبەستم لەهەقیقەتۆچکە، قسەی بەکارهاتووی ڕوون و چەسپاوە، چەسپاوێك کە گرنتی چەسپینی هەمیشەییانت بۆ ناکەم، بەڵام وادەرئەکەون ، بۆنمونە:
وەك یەك کۆ یەك یەکسانە بەدوو

یان دۆست هەر دۆستە
کورش هەرکورشە
دۆست ناگونجێ کورش بێ
کورشیش ناگونجێ دۆست بێ
ئەمە بۆ شتی تریش ئەگونجێ بیڵێین ، بۆنمونە بۆ مەسەلەی بوون و نەبوون ، بوون هەر بوونە،نەبوون هەر نەبوونە،بوون ناگونجێ نەبوون بێت،نەبوونیش ناگونجێ بوون بێت

**-شتێ تێگەشتم کورش، ئەی مەبەستت لەوە چییە کە ئەڵێیت ئەم هەقیقەتانە ئەشێ وەك ژەهریان لێ بێت لەکاتی گفتوگۆدا؟!**
باسی قەومەکەی جەنگەڵی جودیت بیرە کە بۆم گێڕایەتەوە و وتم باوەڕیان بەوە بووە کە خودا لەسەر مانگە و کە لێشیان ئەپرسین بۆ خواوەندەکەتان دیار نییەو نابینرێ،ئەیان وت ئاخر لەپشی مانگەوە ئاکنجی بووە و ئێمەش مانگ پێشی تێ کردووین؟
**- بەڵێ باشم بیرە..ئێ؟!**
ئێ دۆست.. وای دانێ من و تۆ ئەچینە سەرمانگ، چەندین ساڵ لەوێ ئەمێنینەوە و سەردانی پشت و پێشی مانگ ئەکەین و ئەگەڕێین، هەموو جێگایەك سەر پێدادەکەین وەك گەشتیارێکی _چێژ و عیلم و سەرکێشی تەڵەب، خودا نابینینەوە و هیچ ئاسەوارێکیش لەوێندەر نادۆزینەوە، دوای بێینەوە و بڵێین ئەرێ گەلی جەنگەڵی جودی نشین ئێمە چووینە سەرمانگ،ژێرمانگ،بن مانگ،پشت مانگ،پێش مانگ،گشت مانگ! هیچمان نەدی ، خودای چی و شتی چی؟! بەڕای تۆ بەرخوردیان تەکمانا چۆن ئەبێ؟
**- ئاورومان ئەبەن ، کورە لەوانەیە هەر بمانکوژن کورش**
ئێ دۆست ئەمە لای خۆیەوە هەقیقەتێکە بەوانی ئەڵێین، بەڵام ئەوان وەك ئەوەی ژەهریان لەنێو بڕێژین و ژەهراویان کەین بەگژماندا دێن، کەواتە لەم کاتەدا هەقیقەت ئەبێتە شتێکی ترسناك..هەقیقەت وەك پەرچەمێکی سپی ئەکەوێتە لای ئێمە و برواگەلی هەڵەی ترسناکیش ئەبێتە پەرچەمێکی ڕەش و ئەکەوێتە لای قەومی جەنگەڵی جودی، ئەم ڕەش و سپیەش بەیەکەوە هەڵناکەن و نابنە یەك هەرگیز، هەر لەڕووی جوانیشەوە جوان نییە و من باوەڕم بەوەیە کە ئێمە بەجیاوازیەکانمانەوە ناشرینین، وە لەسەریشەوە وتم من منم و تۆ تۆیت ، تۆ هەرگیز ناگونجێت من بیت ، منیش هەرگیز ناگونجێت تۆبم.
دۆست هەمیشە لەبازدان و ڕاوڕاوێندا بێوێنە بوو لەگەرمەی مناقەشەی بابەتێکدا زۆر بەهەرزەییەوە دەیتوانی باز بداتە سەر شتێکی تر
ئەمەش منی بێزار ئەکرد زۆر جار و هەندێ جاریش مایەی خۆشی و پێکەنینم بوو
بۆنمونە، لەباسی فەلسەفە و ئەفلاتون و ئەرستۆوە من دەچوومە قوڵای بابەتێك و ئەو لەناکاو ئەپەڕییە سەر ئەوەی کە مۆبایلێکی تازە هاتووە و شاخی وایە و باڵی وایە و ئەشیەویست بیبەستێتەوە بەباسە فەلسەفیەکەوە!
ئەوکات دۆست، کاتێ نمونەی ترسناکی هەقیقەتم بۆباس ئەکرد، تەواو نوقمی تێڕامان و بێدەنگیەکی جوان بوو بوو، بەڵام لەناکاو بێدەنگی شکاند و بازی دایە سەر بابەتێکی تر و وتی :
**شەوان خەوم باش نییە کورش !**
بۆچی؟ خۆنەخۆش نیت؟
**- نا بەڵام جاری واهەیە ئەچمە بیرکردنەوەی قوڵەوە و خەو لەچاوم ئەتۆرێت، یان چاوم لەخەو ئەتۆرێت**_ئەمەی بەدەم بزەیەکەوە وت_

**بۆنمونە دوێنێ شەو هەم بەزەحمەت خەوتم و هەم خەوی ناخۆشیشم بینی ، بەشێوەیەك كە دووجار خەوتم و دووجاریش بەخەبەرهاتم!**
جا ئەوە کەی شتێکی هێندە خراپە دوست؟ منیش بەوشێوەیەم زۆرجار هەڵدەستم لە خەو دەخەومەوە..
**-واتە تۆش بۆت پێشهاتووە بخەویت و لەناو خەونەکەشتدا بخەویتەوە و دواتر بەخەبەر بێیتەوە هەر لەناو خەونەکەتدا و دووبارە بەخەبەر بێیتەوە!!!**
ئەوە تۆ دەڵێیت چی بۆ خاتری ئاسمان؟!
**- ئێ ڕوونە ئەڵیم چی ...**
**من..** لەوێدا کورش ڕای گرتم وتی:
بۆستە یەك دەقە
دایکم تێل ئەکات
ئەلوو.. سڵاو دایە
بەڵێ واخەریکم دەگەمەوە ماڵ
نانا..هەر بەپەڕەکەیەوە بیکوڵێنە، خۆ من دەرخوادری کوندەپەپویەکی تری ئەدەم
زۆر باشە بۆم دانێ تا دێمەوە
دوای داخستنی تێلەکە، هەوڵم دا مناقەشەکە ببڕێنمەوە و واز بێنم، چوون خەریك بوو ئەگەشتمە شوێنێك لەبیرکردنەوە کە لە هیچ حاڵی نەدەبووم ، پەرتی پەرت بووم بەدەست گێڕانەوەکانی دۆستەوە بەڵام دۆست هەر بەردەوام بوو ، وادیاربوو وەك زۆربەی جارەکان نەیدەویست ئەم باسەکە ببڕێنێتەوە، یان بە ویجدانانەتر بێمە گۆ ، نەیدەویست بەکاڵ و کرچی وازلەباسەکە بێنێت و ئەویست هەرچۆنێك بووە خەتمی کەلامی خۆی بکات
**-باشە کورش، ئێمە چارەکە سەعاتێك ڕێمان ماوە باپێت بڵێم چیم لێ بەسەر هات دوێنێ شەو**
کەوتە پێشم و ڕای وەستانم و بەدەم بزەیەکەوە دەستێکی لەسەر سنگم دانا و وتی :
**ئادەی! ئێ! تەواو! ڕاستییە و خەو نییە!**
وتم ئەکرێ خێرا قسەکانت بکەیت و هێندە هەڵیت و پەڵیت نەڵێیت
**-باشە تەواو کورش دوێنێ شەو تا سەعات3:15دەقە خەو نەچووە چاوم ، بەڵام لەدواتردا ئاگام لێ نەما! واتە لەناکاو خەو بردمیەوە، یان بەجۆرێکی تر بڵێم خەو وەك هێزێکی بێ وێنە بردمیە شوێنێکی وێنەدار، کە هیچ لەڕەنگەکانی ئەو شوێنە حاڵیم نەدەبوو،قسەکان بەدەستی خۆمە لە نێو خەوەکەدا بەڵام شێوازی بەڕێوەچونی خەوەکە نا هەروەك چۆن لەژیان و بەخەبەری و واقیعیشدا ڕەفتارو گوفتارەکان کە دەیانکەم و دەیانڵێم بەدەستی خۆمن بەڵام وێنە و بەسەرهات و پێشهاتەکانی ژیان نا .**
**وەئەمەی ئێستا بۆت باس ئەکەم یەك تکات لێ ئەکەم بە هەڵیت و پەڵیت لێم وەرمەگرە، دوو تکاشت لێ ئەکەم بە پەخشان و شیعر و ڕەوانبێژی لێمی وەرمەگرە، چوون هەر بەڕاسی تا ئەم دەقەیەش زۆر کاریگەری جێ هێشتووە لەسەرم...**

باشە قسە بکە خێرا درێژەی مەیەرێ واخەریکە دەگەینەوە ماڵ

ئەو ئێوارە قسەکانی دۆست تەواو منی خستە گێژاوی بیرکردنەوەوە ، بەڕاستی تەواو شۆك بووم نەم دەتوانی هیچ لێکدانەوەیەك بۆ قسەکانی وی بکەم ، گەشتینە نزیك باخی گشتی و کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتی دوێنێ شەوی ، بەشێوەیەك کەوتە نێو ئەوباسەوە و منیشی ڕاکێشا لەگەڵ خۆی،کە ماڵەوەم ئاگادار کردەوە ناچمەوە و درەنگ ئەکەوم و کارێکی گرنگم بۆ هاتۆتە پێش..

بەهەرحاڵێك بوو دۆست بەم شێوەیە هاتە گۆ ئەو ئێوارەیە:

**- کورش**
**زۆرجار لە خەومدا قسەم کردووە لەگەڵ خۆم و لەگەڵ کەسانی ناو خەوەکەشم بەشێوەیەک ڕێک وەک واقیع و وەک ئەوەی بەخەبەربم ، بەدڵی خۆم و بەو شێوەیەی کەدەمەوێت پرسیارم کردووە لێیان و قسەم کردووە.**
**تەنانەت زۆربەی جارەکانیش کە خەون دەبینم و خەونەکە زۆر نا خۆشە**
**بۆنمونە کەسێکی دەموچاو تاریک و گەورە بەدوام کەوتووە یان لەسەر بانێکی بەرز کەوتوومەتە خوار یان کاتێ فڕیوم، بەر سیمی گەورەی کارەبا کەوتووم،یان چەند کەسێک بەزۆر بردوومیان بەرەو سە کۆی سەربڕین، بە پێکەنین و بە دڵ خۆشییەکەوە لەخەوەکەمدا بە خۆمم وتووە "هیچ نییە تۆزێکی تر خەبەرم دەبێتەوە و ئەمانە هەمووی خەون و ڕاستی نین " ئیتر هەر واش بووە..**
منیش وام لێ بەسەر هاتووە..ئێ؟!
**-ئێ هەندێ خەونیش هەبووە هێندە لەڕاستی چووە نەم توانیوە و فریا نەکەوتووم بڵێم بەخۆم خەوە و هیچ نییە خەبەرم دەبێتەوە ، بۆنمونە دوێنێ شەو**
**لە خەونمدا بەئاسایی وەك چۆن ڕۆژانە ئەچمەوە بۆماڵ ، ئاوها ئێوارێ درەنگ چوومەوە ، دایکمم بینی جیاواز بینیم ، جلەکانی ڕەش بوو لەچکەکەشی کەلەملیدا بوو ڕەش بوو، برۆ و برژانگ و قژی ڕەش بوو ، نینۆکەکانی بۆیەیی ڕەشی لێدابوو، خەریك بوو کەوچکی لەنێو مەنجەڵێك ڕادەدا لەسەر ئاگرەکە کە پەلەوەرێکی پاکنەکراوی کەلە زلی مل قایم بەقەد قایمایی لاشەکەی خۆی تێدا بوو، سەیرم لێ هات ، وتم دایە ئەوە چییە لەنێو ئەو مەنجەڵەدا؟**
**جوابی نەدامەوە!**
**سەیرێکی نێو مەنجەڵەکەم کرد بەوردی ، چاوی کراوە بوو ئاگرەکە و ئاوەکوڵاوەکە خەریك بوو کەفی لەچاوە شێواوەکانی پەلەوەرەکە دەهێنایە دەرەوە.. بێ ئەوەی خۆم بمەوێت و هەروەك چۆن یاریزانێکی شەترەنج بێ ئەوەی پرس بە خانەی شەترەنجەکە بکات دانەی شەترەنجەکە ئەجوڵێنێت بەدڵی خۆی ئاوا فەزای خەوەکە بردمییە حاڵێکی بێ باکی و لەبیرچوونەوەوە دەرهەق بەو دیمەنە ناشرینەی پەلەوەرەکە کەلەنێو مەنجەڵەکە بینیبووم و خۆم لەلایەکی تری چێشتخانەکەدا بینیوە، دایکم بەهەمان وێنە لەسەر مەنجەڵەکە خەریکی پەلەوەرەکە بوو، ڕێك ئەتوت ڕقێکی زۆری لەو پەلەوەرەیە و ئەیەوێ تا گەردی بمێنێت کەوچکی لێدات!**
**وتم ئەمڕۆ زۆر جوان خۆت گۆڕیوە دایە**
**جوابی نەدامەوە!**
**وتم بۆچی ئەم گونجاندنەت لە جل و بەرگ و ڕەنگی سەرتدا بەڕەش کردووە**
**جوابی نەدامەوە!**
**بێ وەڵام وەرگرتن و بێ ئەوەی نارەزای دەربرم ،بەسەر پلیکانەکانداسەرکەوتم و چوومە ژوورەکەی خۆم، لەسەر سیسەمەکەم ڕاکشام**
**هێندە ماندوو بووم**
**کە هەر زوو کۆی گشتی وێنەکانی ناو خەوەکەم بێدەنگ بوون و منیش چاوم چوویە خەوێکی تر، لەنێو ئەو خەوەمدا کەخەو بردبوومیەوە دووبارە خەوم بینیەوە لەماڵێکی تاریکدا پیاوێکی چەرم لەبەری دەموچاو نەبینراو دوام کەوتبوو ، من بەخێرای و هەناسە بڕکێوە ڕامدەکرد و هەموو هێزی**

قاچی خۆم خستبوویە کار تا نەمگرێتەوە و ئەویش بە خێراییەکی زۆر بەدووم کەوتبوو سات بە ساتیش نێوانمان کەمتر دەبوویەوە ، لە ناکاو گەشتمە سەربانی خانویەك، دەرەوە تەواو تاریکبوو و ئەویش گەشتە سەرم لە ترسدا خۆم فڕەیایە خوارەوە بۆسەر کۆنکرێتێک ، پێش ئەوەی بدەم بەئەرزەکەدا و مێشکم بپژێت ، بەتووندی لەخەو ڕابووم و سە یرم کرد سەعات 3:15 دەقەی شەوە زۆر تاریک بوو ڕێک لەخۆشیدا هەستامەوە و چووم بۆ لای تەرمۆزی ئاوەکە تا کەمێ ئاو بخۆم، دیار بوو دایکم و ئەوان خەوتبوون و کاتێکیش من خەوتبووم بۆنانخواردن خەبەریان نەکردبوومەوە، ماڵەکە بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات .. بەخێرای شتێ هات بەمێشکمدا ئەوکات وتم تۆبڵێیت ئەو پەلەوەرە پیسەیان خواردبێ ئێوارە کاتێ من خەوتووم!

بەڵام هەرزوو وازم لەبۆنی ناخۆشی ئەو پرسیارە هێنا و بەهەرحاڵێك بوو دەستم بۆ دۆلکەی ئاوەکە برد و لەبەر شێری تەرمۆزەکەدا ڕام گرت تاپڕببێت و کەمێ گەرووی وشکم کە لەترسی پیاوی نێو خەوەکەمدا ببو بە پەڵاش تەڕبکەمەوە، سەیرم کرد هەر هەمان ئەو پیاوەی لەخەونەکەدا دوام کەوتبوو لە پشتمەوە وەستاوە و دیاربوو هەر لەوکاتەوە دووام کەتبوو لەخەوەکەدا ماندوو بونەکەی نەبڕابوویەوە و گوێم لەدەنگی هەناسە بڕکێی بوو، لەپشتمەوەو منیش پەرداخی ئاوەکە بەدەممەوە وشک بووبوو هەر ئەوکات بۆم دەرکەوت کە دوام کەوتووە بۆ جیهانی ڕاستەقینە و واقع و لە گەڵ خۆمدا کەهاتمە دەرەوە لە بازنەی خەوندا هاتووە لەگەڵم!

ئیتر وتم ئەمە ڕاستییە و تەواو کاتی ڕۆح دەرچوونمە

گەشتبوومە لوتکەی "تۆقین"

هەر کە دەستی لێ نزیک کردمەوە لاشەم ساردبوویەوە وەکو لاشەی مردوو ، پێش ئەوەی دەست بدات لە قژم هەستم بە گەرمی و سات بەسات نزیک بوونەوەی دەستی دەکرد بەرەو لاشەم ، لەو کاتەی کە تەواو خۆم دابوو بەدەستەوە و ئیتر هێز نەمابوو لەلاشەمدا لەناو عارەقێکی زۆردا بە ڕاستی ڕاچڵەکام و گوێم لە دەنگی قۆری و پیاڵەکان بوو کە دایکم چای تێ دەکرد.

بۆیە چەند دەقەیەک لەترسدا نەم دەوێرا هەستمەوە

تاتەواو بۆم ڕوون بوویەوە کە بەیەکجاری بەخەبەر هاتوومەتەوە.

کەزانیم تەواو تێپەڕی و کابوس بووە لە خۆشیدا چووم بە ئاوی سارد دەمووچاوم شۆرد و ڕۆشتمە لای دایکم ، کە دایکمم بینی دەتوت چەندین ساڵە نەم دیوە هێندە بە پەرۆشەوە لێم دەڕوانی وهێندە ترس چووبویە لاشەم

دایکم بینی بێ ئەوەی هیچ ڕەنگێگی ڕەشی بەخۆیەوە کردبێت، پرچێکی جوانی خورمایی وەك هەموو کات، نینۆکێکی هەر بەسروشت پەمەی و کراسێکی تەخت مارۆنی گوڵ زەردی لەبەر بوو

بەخۆمم وت ئای چ خۆشییەکی تێدایە ژیان!

وای دایکم چەند جوانە!

تۆ سەیر پیاڵەکان چەند پاکن، من بۆ هێندە خەم سارد بووم لەخەونمدا و نەمپرسی لەدایکم ئەوە بۆچی هێندە بەقێزەونی ئەو پەلەوەرەت بە پەڕەوە کردۆتە نێو ئەو مەنجەڵە، کورش باوەڕناکەیت کەچەند خۆش بەخت بووم کە خەوەکەم ڕاست نەبوو ، چەند شاد بووم کە دوای ئەو هەمووە ناڕەحەتی و ترسە گەڕامەوە نێو ئارامی و دوونیای ڕوناکم بینیەوە . هەموو شتەکانم جوانتر دەبینی..

وتم بەخۆم:

من چەند ناشوکرم بەرامبەر بەڕووناکی

من چەند بێ شعورم بەرامبەر بە شتەجوانەکان

**ئەبێ کەی بێ بەیەکجاری ڕاچڵەکێم و درک بە " حەقیقەت " بکەم ؟!**
**کورش پێم بڵێ ، لێکدانەوەی خۆتم پێ بڵێ سەبارەت بەمە**
**دەی تکایە؟ تۆش شتی وات لێ بەسەرهاتووە؟!**
**چاوەکانی کورش ، وەك ئەڵماس دەبریقانەوە**
**بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێ بووم شتێ بڵێت**
**هەرکە وسیتی قسەبکات**

لەو کاتەدا ڕاچڵەکام..
سەیری کات ژمێرم کرد کات 3:15شەوبوو
کەمێ بیرم کردەوە و وتم چەند خۆشە ئەم گفتوگۆیەی نێوان کورش و دۆست لەڕاستیدا بوایە و منیش لەگەڵیان بەژدار بوومایە... گڵۆپەکەم کوژاندەوەو بەئارامی چاوم لێك نا

٢٨/١٢/٢٠١٥